## پێرست

**المقدمة:**

التعبير الكتابى، هو إمتلاك القدرة على نقل الفكرة أو الإحساس إلى الآخرين كتابة، مستخدما مهارات لغوية.

إذا كانت المعانى واضحة فى النفس فتكون التعبير عنها سهلة.

و الهدف منه أن يتقن الطالب إستخدام المهارات اللغوية المختلفة التى اكتسبها من خلال تعلم فروع اللغة المختلفة، مستفيدا من المناقشة على طريقة السؤال و الجواب، و بناء الجملة فالعبارة بشكل سليم و إستخدام الصور الفنية الجميلة مما يعطى الموضوع حلاوة و جمالا.

و هنا نقدم بين يديك بعضا من التعابير الكتابية باللغتين العربية و الكردية راجيا أن يكون عونا فى تذليل مصاعب التعلم فى هذا المجال.

# دەستپێک

دەربڕین بە شێوەی نووسین، خاوەنیەتی و توانا بوونە لەسەر گواستنەوەی هەست و بۆچوونی بۆ کەسانی تر بە شێوەی نوسین، بە بەکارهێنانی شارەزاییەکانی زمانەوانی.

ئەگەر مانای بۆچوونەکان ڕوون و ئاشکرابون ئەوا دەربڕینی بە شێوەی نووسین ئاسان دەبێت.

ئامانج لەمەدا خوێندکاران تێبگەیەنرێت لە بەکار هێنانی شارەزاییە زمانەوانیەکان کە بە دەستی هێناوە لە کاتی فێربوونی لقە زمانەوانیە جیاوازەکان، بە سوود وەرگرتن لە هێنان و بردن بە شێوەی پرسیار و وەڵام، وە دروستکردنی ڕستەکان پاشان دەستەواژەکان بە شێوەیەکی دروست، وە بەکارهێنانی شێوازە هونەریە جوانەکان کە ئەبێت بە هۆی بەخشینی شیرینیەک و جوانییەک بە باسەکە.

لێرەدا هەندێک لە دەربڕینەکان بە شێوەی نوسین بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی پێشکەش بە ئێوە دەکەم، ئومێدەوارم یارمەتیدەر بێت لە زاڵ بوون بە سەر نارەحەتیەکانتان لەم بوارەدا.

# كيفية كتابة التعبير الكتابى

يقسم النص فى التعبير الكتابى إلى أربعة أقسام رئيسية هى:

**أولاً:** المقدمة؛ تكون موجزة قصيرة تعطى تمهيدا عن الموضوع و غالبا ما يتكون من سطرين أو ثلاثة أسطر.

**ثانياً:** الموضوع؛ و هو شرح الفكرة المطلوبة، أو الأفكار المراد الحديث عنها، و يتكون الموضوع من عدة فقرات، و تحوى كل الفقرات ترابطا فكريا و موضوعيا معا.

**ثالثاً:** تقوية الموضوع؛ تكون ترسيخ الفكرة بالآية القرآنية أو حديث النبوى أو بيت شعر أو قول أحد الحكماء.

**رابعاً:** الخاتمة؛ و هى عبارة أو جملة صغيرة تدل على أختتام الموضوع و انتهائه.

# چۆنیەتی دەربڕین بە شێوەی نوسین:

ئـەو دەقـەی ئەنوسـرێتەوە دەکرێـت بـە چـوار بەشـی سەرەکی بریتیە لە:-

**یەکـەم:** دەسـپێک؛ بـە شـێوەیەکی کـورت و پوخـت کـە پێشـەکیەک دە بێـت لەسـەر باسـەکە زۆربـەی کـات خـۆی دەبینێتەوە لە دوو دێر یان سێ دێردا.

**دووەم:** باسـەکە؛ باسـی بۆچوونـە مەبەسـتەکەیە، یـان ئـەو بیرۆکانـەی ئەتـەوێت لـە بارەیـەوە بـدوێیت، باسـەکە پێکـدێت لـە چەنـد بڕگـەیـەک، نـاوەرۆکی هـەموو بڕگـەکان پەیوەستن بە یەکەوە لە ڕووی بیرکردنەوە و باس کردنەوە.

**سـێیەم:** بـەهێزکردنی باسـەکە؛ پتـەو کردنـی بیرۆکەکـە دەکرێـت بـە ئایـەتێکی قورئـانی پیـرۆز یـان فەرموودەیـەکی پێغەمبـەر {درووودی خـوای لـێ بێـت} یـان دێـرە هۆنراوەیـەک یان وتەیەکی داناکان بێت.

**چـــوارەم:** کۆتـــایی؛ بریتیـــە لـــە نووســـینێک یـــان دەستەواژەیەکی بچوک ئەوە دەگەیەنێت باسەکە تـەواو بـوو وە کۆتای پێهاتوە.

# قواعد كتابة تعبير مميز:

هناك عدة أمور يجب مراعاتها عند كتابة التعبير حتى نحصل على التعبير المميز، أهم هذه القواعد ما يأتى:

١-مراعاة علامات الترقيم من فواصل و نهاية الجمل.

٢- وضوح الخط بحجم مثالى للعين، و أن يكون خاليا من الخربشات و الشطبات.

٣- ترابط و تسلسل الأفكار، و ضمن الموضوع المطلوب. فلا تخرج عن هذا النطاق حتى لا يظهر تشتت الكاتب، و بهذا يبتعد عن الفكرة الرئيسية للتعبير.

٤- أن تكون الكلمات بلغة العربية الفصيحة، مع الحرص على تجنب العامية، و عدم تكرار الجمل، و أن تكون خالية من الأخطاء الإملائية.

٥- مراعاة التنسيق المناسب بين كلمة و أخرى و بين جملة و أخرى.

# بنەماکانی دەربڕین بە شێوەیەکی نموونەیی

لێرەدا چەند خاڵێک هەیە پێویستە ڕەچاوبکرێت لە کاتی نووسینی هەر دەربڕینێکی نووسینەکە هەتا نووسینێکی نموونەیی بە دەستبهێنین، گرنگترین ئەو بنەمایانە ئەمانەن کە باسی دەکەین:-
١-ئاگاداری نیشانەکانی خاڵبەندی لە نێوان و کۆتایی ڕستەکاندا.
٢-نووسینەکە ڕوون بێت بە فەرمایەکی پێویست لە ئاستی خوێندنەوەی جاودا بێت، دوور بێت لە بچڕان و کورتاندنەوە و نەربەک کەوتن.
٣-دەبێت بیرۆکەکان پەیوەست بن بەیەکەوە بە شێوەیەکی یەک لە دوای یەک، ئەو باسە داوا کراوەی گرتبێتە خۆ،دەرنەچێت لەو نێوانەدا بۆ ئەوەی پەرش و بڵاوی نووسەری تیا بەدی نەکرێت.
٤-ئەرێت وشەی بەکارهێنراو بە زمانی عەرەبی ڕەوان بێت، خۆت بە دوور بگریت لە بەکارهێنانی ئەو عەرەبییە کە پێی دەوترێت (عامی)، دووبارە نەکردنەوەی ڕستە، پێویستە دووربێت لە هەڵەی نووسین،لە نزیکبوونەوەی کارە خراپەکان.
٥-بەئاگابوون لە ڕێکخستنی گونجاو لە نێوان وشەیەک و وشەیەکی تر، وە لە نێوان ڕستەیەک و ڕستەیەکی تر.

# الأخلاق

الأَخْلاق هي عِبارَة عَنْ مَجْموعَة مِنَ المَبادىء وَ القَواعِد الّتي تُساعِدْ عَلى تَنْظيم سلُوك الأنْسان، وَ يَجْعَلُها تَبْدو بِالشكل الأَكْمَل، في كافّة تَعامُلاتِه مَعَ نَفْسِه وَ مَعَ الله وَ غَيْرِهِ مِنَ البَشَرِ وَ المَخْلوقات الأُخْرى. وَ هي الضمانَة الأكيدَة الرئيسيّة لِحِصانَة المُجْتَمع.

فَالأنْسان الذي لا أَخْلاقَ لَهُ مِعْولٍ بِهَدمِ المُجْتَمَع. وَ قالَ الشّاعِر:

**إنّما الأممِ الأَخْلاق ما بَقيَتْ**
**فإنْ هُمْ ذَهَبَتْ أخْلاقُهُمْ ذَهَبُوا**

لا شَكَّ بِأن الأَخْلاق هي سِمَة المُجْتَمَعات الرّاقِيَة المُتَحَضِرَة، فَأَيْنَما وجدَتِ الأَخْلاق تَفْتَحُ بابُ الحَضارَة وَ الرّقى وَ التَقَدّم.

وَالأَخْلاق الحَسَنَة هي حالَة إنْسانيَة سلوكيّة يَسْعى كَثير مِنَ الناس الباحثينَ عَنِ الكَمال للوصول إلَيْها وَ إدْراكِها، وَ الإسْتِفادَة مِنْها.

وَ مِنْ ثَمَراتِها الكَرَم وَ العِفّة وَ الصّدق وَ الأمانة وَ الشّهامَة وَ الحَياء.

فَأي مُجْتَمَع لا يَنال حَظّهُ مِنْ هذهِ الخِصال، كانَ ذلك خَسارة وَ بالاً عَلَيه.

فَعَلَيْنا دخُول قلُوب الآخَرين بِالسّلوك الناطِق وَ بِالصّفات الكَريمَة وَ الأَخْلاق الحَميدَة.

# ڕەوشت

ڕەوشــت بریتیــە لــە کۆمەڵــە پرەنسـیپ و بنەمایــەک کــە یارمــەتی ڕێکخســتنی هەڵســوکەوتی مــرۆڤ دەدات، وای لێــدەکات بــە شــێوەیەکی تــەواو دەربکــەوێت، لــە هــەموو هەڵســوکەوتەکانی لەگـەڵ خـۆی و خـوداو خـەڵکانی تـر لـە ئادەمیزاد و دروستکراوەکانی تردا، ئـەمە گرنتیەکی تـەواوی سـەرەکیە بۆ پاراستنی کۆمەڵگا.

ئەو مرۆڤـەی کـە خـاوەن ڕەوشـت نییـە وەک دەمـە پاچێـک وایە کۆمەڵگا دائەروخێنێت. شاعیر دەڵێت:

**مانەوەی گەلان بە ڕەوشتەوەیە**

**ئەگەر ڕەوشتیان لەدەستدا تیا دەچن**

بێگومــان ڕەوشــت ڕواڵــەتی گــەلانی شارســتانی و پێشــکەوتوون، لەهــەر شــوێنێک ڕەوشــت هــەبێت دەرگــای شارستانی و پێشکەوتن دەکرێتەوە.

ڕەوشتی بـاش شـێوازێکی هەڵسـوکەوتی مرۆڤـە، زۆر لـە لێکۆڵـەرەوەکان هەوڵیانـداوە بـە تـەواوی بەدەسـتی بهێـنن و پێبیگەن، و سوودی لێ وەربگرن.

لــە بەرهەمــەکانی ڕەووشــت دڵفراوانــی، پاکیــەتی، ڕاستگۆیی، دەستپاکی، پیاوەتی و شەرمکردن.

هەر گەلێک یەکێک لەم تایبەتمەندییانەی لەخۆ نەگرتێ، ئـەوە زەرەر و قورسـاییە لـە سـەری. پێویسـتە بچینـە دڵـی کەسانی تر بە ڕەوشتێ دەربڕینەکەی بە بەها بەرزەکان و ڕەوشتە سوپاس لێکراوەکان.

# الهاتف المحمول

هُوَ وَسيلَة اتّصال اللاسلْكِيَة تعْمَل مِنْ خِلال شبكه من أبراج البث المُوَزعـه لِتغْطيَة مَساحات مُعيّنه، وَ ترابط فيما بَعد بواسطة خطوط ثابتة أوْ أقْمار صناعيَة، وَ تَعود تاريخ نَشأتهُ إلى عام ١٩٤٧م عَلى يَد (كوبر) الباحث الأمريكي.

جَرَتْ أوَّل مُكالَمة هاتفيَة منَ الهاتف النَقّال عام ١٩٧٣م.

فهُوَ وَسيلَة الإتصال الأسْرَع، إنّهُ عِدة أجْهزة في جهاز واحِد و هي: هاتف، آلة تصوير، مُنبّه، آلة حاسبة، مُتصَفح الأنترنت وَ في مَجالات أخرى، كُلّها أجْهِزَة ضَرورية لِحَاياتنا اليَومية، وَ نِعمَة مِنَ الله لِلّذينَ يَسْتَخْدِمُونَهُ بِصُورة صَحيحه.

وَ غَيْر مُكَلِف ماديّاً كَثيراً لِمَنْ يَسْتَخْدِمُهُ بِحِكمَة وَ عَقل، و لكِنّه في ذات الوَقْت باهِض الثّمَنِ لِمَن يَسْتَخدمُهُ طُوال الوَقْت فيما يُفيدُ وَ ما لا يُفيد.

وَ يُؤثِرُ بِالأشْعاعْ عَلى الدّماغ، وَ على العَيْنِ، وَ على النّفس، لِمَنْ يَسْتَخْدِمُهُ وَقْتاً طَويلاً.

وَ في النِهاية أنَ الهاتِف المَحْمُول سِلاح ذو حَدَّيْن الخير وَ الشَر، عَلَيْنا أنْ نَسْتَعْمِلها لِحاجاتنا الضَرورية، بَعيداً عن التَلاهي وَ ضِياع الوَقْت، وَ الإهْتِمام بالكُتُب وَ الدّراسَه و تَنظيم أوْقاتِنا بِصُورَة مُنَظَّمَة وَ صَحيحه.

# مۆبایل

ئامێرێکی گەیاندنی بێتەلـە کاردەکات بەهۆی شـەپۆلە و کە لـە بورجەکانـەوە پـەخش دەکرێـت بۆ ئـەو شـوێنانەی بە ئەندازەی خـۆی دیاریکراوە، پاشـان پەیوەسـتکراوە بـە چەنـد هێڵێکـی جێگیـر یـان مانگــە دە سـتکردەکانەوە، کـاتی دامەزرانـدنی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٩٤٧زایـی لەسـەر دەسـتی (مـارتن کـوپر) لێکۆڵـەری ئـەمریکی، یەکـەم قسەپێکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٣زایینی.

ڕێگایەکی گەیەنەری خێرایە، ئەمە چەند ئامێرێکە لە ناو یەک ئامێردا، کە بریتیە لـە تەلـەفون، کـامێرا، ئاگادارکەرەوە، ژمێریـار، گـەڕان لـە ئینتـەرنێت وە چەنـدین بـواری تـر کـە هەمووی ئامێری پێویستن لە ژیانی ڕۆژانەماندا.

بەخشـندەییەکی خودایـە بـۆ ئەوانـەی بـە شـێوەیەکی دروست بە کاری دەهێنن.

زۆر گران ناکەوێت لەسـەر ئەوانـەی کـە بـە کـاری دەهێـنن بە دانایی و ژیری، بـەڵام لـە هـەمان کاتدا زۆر قورس و گران دە کـەوێت لەسـەر ئەوانـەی کە بە درێژایـی کـات بـە کـاری دەهێنن لە شـتی بەسوود و بێسوود.

کاریگـەری تیشـکەکەی لەسـەر مێشـک، چـاو، وە دەروون هەیە بۆ ئەوانەی کاتێکی زۆری لە گەڵدا بەسەر دەبەن.

لە کۆتاییدا مۆبایل چـەکێکی خـاوەن دوو ئاراسـتەیە، چاکە و خراپە، پێویسـتە لەسـەرمان بـۆ کـارە پێویسـتەکان بـەکاری بهێنین، دورکەوینەوە لـەخۆ پێـوە هەڵکێشـان و لەدەسـتدانی کـات، وە گرنگـی دان بـە کتێـب خوێندنـەوە ڕێـک خسـتنی کانەکانمان بە شێوەیەکی ڕاست.

# الأم

الأم كَلِمَةٌ يَحْويها مِنَ الجَمالِ ما لا يَحْتَوي غَيْرها مَعَه، وَ لا يُضاهي في وَصْفِها أمْرٌ آخَرْ مِنَ الحَياة.

تَسْتَطيعُ الإرْتِكاز عَلَيْها، إنَّها سِرُّ الوجُودِ الّذي حَمَلْنا في جَسَدِها، وَ رِعانا بِاللّطف، وَ تَحَمّلَ ألَمِنا وَ ألَم ولادَتِنا، وَ سَهرِ اللّيالي الطَويلات، وَ كانَتْ الحَنونَة عَلى بَقائنا وَ إدامَة حَياتِنا، حَتى أصْبَحْنا بِهذهِ القُوّة الّتي نَحْنُ عَلَيْها، عَلَيْنا أنْ لا تَنْسى فَضْلُ أُمَهاتِنا وَ لا نَحْزُنْها أبَداً. قالَ الشّاعِر:

**الأم مَدْرَسَة إذا أعدَدْتَها**
**أعدَدْتَ شعْباً طَيِبَ الأعْراق**

وَ هي مَدْرَسَة وَ راعِيَة مادامَتْ في الحَياة، وَ الأنسان يَبْقى في الأمانِ وَ الحَصانَة طالَما الأم على قَيْدِ الحَياة، فَهي دائِماً تَكونُ حَريصَة عَلى أوْلادِها وَ مَهْما كَبرُوا في العُمْرِ فَهي تُدَلِلُهُمْ وَ تَخافُ عَلَيْهِمْ مِنْ أي مَكْرُوه يَقِفُ عَلى أوْلادِها.

الواجِبُ عَلَيْنا أنْ لا نَنسى عَظَمَة أمَهاتِنا وَ لاتَحْزُنْهُنّ أبَداً، إنَّهُنَ الجَنَّة في الدُنْيا وَ الآخِرة، وَ مَجْمَعْ لِلْحُبِ وَ الرَّحْمَة، وَ مَنْبَع لِلسّعادَة.

وَ لا يَسْتَطيعُ أحَد مُكافَئَتِها بِقَدَرِ ما قَدَمِها، وَ لكِنْ نُقَدِمُ قَليلاً أمامَ إعْطائِها الكِثير، و مَهْما كَتَبْنا فَلَنْ نَقْدِر أنْ نُوصِفَ الأم وَ أهْميَتُها وَ دَوْرُها العَظيم.

# دایک

دایک وشـەیەکە تـەواوی جوانییـەکان لـە خۆدەگرێـت کـە شتانی تر لە گەڵیدا کۆنابنەوە، وە هـیچ پێناسـەیەکی تـر لـە ژیاندا لەو ناچێت.

ئەتوانین پاڵی پێوە بدەین، ئەو نهێنـی بەدیهێنانـە، کـە لـە ناو لەشـی خۆیدا هـەڵیگرتین، چـاودێری کردین بـە نـەرم و نیانیـــەوە، ئـــێش و ئازارەکـــانی هـــەڵگرتین وە ئـــازاری لـــە دایکبـــوون، شـــەو بـــە ئاگـــابوونی شـــەوە درێژەکـــان، خۆشەویســـتیەکی زۆر هـــەبوو بـــۆ مانـــەوە و درێـــژە پێـــدانی ژیانمـــان، هـــەتا گەیشـــتینە ئـــەم هێزوتواناییـــەی ئێســـتامان، شاعیر دەڵێ:

دایک قوتابخانەیە ئەگەر ئامادەبکرێ
گەلێکی باش و ڕەسەنت ئامادەکردوە

ئـەو قوتابخانەیـە و چـاودێرە ئەگـەر لـە ژیانـدا بێـت، مـرۆڤ ئەمێنێتەوە بە پارێزراوی بـە درێـژای بـوونی دایـک لـە ژیانـدا، ئەو بەردەوام سورە لە گرنگیدانی بە منداڵەکانی هەرچەنـدە گەورەبووبن لە تەمەندا، ڕێنموونیـان دەکـات ئەترسـێ لـەوەی تووشی هەر بەڵایەک ببن.

پێویستە لەسـەرمان گەورەیی دایکانمـان لـەبیر نەکـەین وە بـەهیچ شـێوەیەک غـەمباریان نەکـەین، ئـەوان خـۆش گـوزەرانین لـە ژیـانی ئێسـتا و دواڕۆژدا، کۆکـەرەوەی خۆشـەویستی و بەزەیی، سـەرچاوەی خۆشبەختین.

هیچ کەس ناتوانێت پاداشتی بداتەوە بە ئەندازەی ئـەوەی پێشکەشـی کـردوە، بـەڵام کـەمێکیان پێشـکەش ئەکـەین بەرامبەر بەخشینە زۆرەکانی ئەوان، هـەر چەنـدێک بنوسـین نـاتوانین وەسـفی دایـک و گرنیـەکانی و ڕۆڵـی گـەورەییان بکەین.

# طموح الحياة

إنَّ الطّموح يَعْني الجِد وَ الإجْتِهاد وَ المُثابَرة في سَبيل تَحْقيق الإنْسان لِمُبْتَغاه، وَ يَعني أيضاً عَدَم اليَأسِ وَ الخضوع.

إنَّ القُدرات العَظيمَة الّتي يَسْتَنِدُ الأنسان عَلَيْها، ما كانَتْ ذات قيمَة، لَوْلا الطمُوح وَ المُحاوَلة بِتَحْقيق الأفْضَل، وَ بلُوغ المَراتِب الأعْلى، وِ إمْتِلاك أنْواع القُوَّة المُخْتَلِفَة الّتي تَمَكّنَ الأنْسان مِن الإرتِقاء في كافّة المَجالات الحَياتيَة، مُسْتَغِلاً كُلَ الفُرَص المَتاحَة أمامَه، وَ كُل مَهاراتِه، وَ قُدُراتِه الّتي يَمْتَلِكُه، وَ الإسْتِمْرار على ذلك.

وَ الحَياة مَدْرَسَة، أسْتاذُها الزَّمان، وَ دروُسُها التَّجارب، لا تَحْتاجُ إلى طَلَب إنْتِساب وَ لا إلى حِجْز مَقْعَد، بَلْ تَسْجُلُ فيها أوّل لَحْظة تَخْرُج إليها، نَتَعَلَّمُ مِنْها، نَكْتَسِبُ خِبْرات، وَ نَتَعَلّم مَعارِف، وَ نَتَدَرَّبُ وَ نَطورُ مَهارات، وَ نَعْمَلُ وَ نَجْتَهِدُ نَنْجَحُ أحْياناً وَ نَنْصَدِم أحْياناً أخْرى.

وَ لا نَنْظُرُ إلى الأحْجار المُتَناثِرة حَوْلَنا، بَلْ نَجْمَعُها وَ نَبْنى مِنْها سُلّم نَرْتَقى به إلى النَّجاح.

عَلَيْنا بِناء حَياتِنا عَلى أسَس ثابِتَة وَ نَعْلَمُ مِنْ أخْطاء الماضي، لِتَحْقيق أهْدافِنا خِدمَة لَنا وَ لِأجْيالِنا القادِمة.

# زۆر خۆشەویستی ژیان

زۆر ویستن مانای گرنگی پێدان و تێکۆشانی بەردەوامی مرۆڤ لە پێناو جێبەجێ کردنی ویستەکان و ئامانجەکانی، وە مانای مل کەچ نەکردن و چۆک دانەدان.

ئەو هێز و توانا گەورانەی کە مرۆڤ پاڵی پێوە دەدات، هیچ گرنگیەکی نەئەبوو ئەگەر زۆر ویستن و هەوڵدان نەبوایە بۆ بەدی هێنانی چاکتر، گەیشتن بە پلە بەرزەکان، خاوەنداریتی جۆرەها هێزی جیاواز کە توانا بەخشە بە بەرزکردنەوەی مرۆڤ لە کایە جۆراوجۆرەکانی ژیان، بە بەکارهێنانی هەموو هەلێکی گونجاو لەبەردەمدا، وە هەموو لێهاتوویەکانی، وە هەموو تواناکانی، وە بەردەوامی لەسەر ئەمە.

ژیان قوتابخانەیە، مامۆستاکەی رۆژگارە، وانەکانی تاقیکردنەوەکان (بەسەرهاتەکان)، پێویست ناکات داوای ئەندامێتی تیا بکەی، یان جێگە دابین بکەی، بەڵکو لە ساتەکانی هاتنە ناوەوە تۆمار دەکرێ، تیایدا فێر دەبیت، شارەزای بەدەست ئەهێنی، فێر زانیاریەکان ئەبیت، مەشقی تیادەکەین تواناکان پێش ئەخەین، و کار دەکەین و تێدەکۆشین هەندێ کات سەرئەکەوین، تووشی بەریەک کەوتنیش ئەبین هەندێ کاتی تر.

سەیری بەردە پەرش و بڵاوەکانی دەور و پشتمان ناکەین، بەڵکو کۆی ئەکەینەوە و قادرمە ی لێ دروست دەکەین پیا سەردەکەوین بۆ سەرکەوتن. پێویستە لە سەرمان ژیانمان دروست بکەین لەسەر بنەمایەکی جێگیر وە فێرببین لە هەڵەکانی رابردوو، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانمان وە بۆ خزمەتکردنی خۆمان و نەوەکانی داهاتوو.

# الشباب

الشّبابْ هُمْ بَراعِمُ الرَّبيع لِشَجَرة المُجْتَمَع، هُمْ كَالجُذورِ وَ النّوى الّتي تَحْمِلُها الثّمار، وَ إنّ الحَياة المُشْرِقة وَ المُزْدَهَرة سَوْفَ تُولَدُ مِنْ هذه البُذورِ وَ النّوى.

الشّبابْ هُمْ عِمادُ كُلُّ أُمّة وَ أساسُها، فَهُمْ قادَة سَفينة المُجْتَمَع نَحْوَ التَقَدّم وَ التَطَور وَ نَبْض الحَياة في عروق الوَطَن، وَ نِبراسُ الأمَلِ المُضئ، وَ بَسْمة المُسْتَقْبَلِ المُنيرَة وَ أداة فَعّالة لِلْبِناءِ وَ التّنْمِية.

فَالمُجْتَمَعُ الّذي يَمْتَلِكُ هذا العُنْصُر الثَمين، يَمْتَلِك القُوّة وَ الحَيَويَة وَ التَقَدّم عَلى سائِر الأمَمْ، فَهُمْ سَبَبُ نَهْضَة الأمَمْ، وَ سِرُّ قُوَّتِها، وَ عِمادُها، وَ حَصْنُها المَنيع، وَ سَيْفُها الحامي، وَ دِرْعُها الواقي وَ ذَخيرَتُها الّتي لا تَنْتَهي، فَالنَّصْرة بِالشّباب.

وَ حينَما يَغيبُ دَوْر الشّبابِ عَنْ ساحَة المُجْتَمَع أوْ يَساءُ مُمارَسَتَهُ، تُسارِع إلى الأمّة بَوادِر الرّكُود وَ تَدَهْوَرِ النّشاطِ وَ تَوَقّف عَجْلَة التَقَدّم.

وَ على الشّباب أنْ يَسْتَثْمِروا طاقاتِهِم وَ جهودِهِم لِخِدْمة المُجْتَمَع، وَ النهُوضْ بِهِ لِإحْراز التَّقَدُّم، وَ التَطَور في كافّة مَجالاتِ الحَياة.

وَ يَجِبْ توفير الإحْتياجاتِ اللّازِمَة لَهُمْ، حَتّى يَسْتَثْمِرُوا طاقاتِهِمْ بِالشّكل الإيجابي لإحْداث تَغيرات فاعِلَة، تَعُود بِالنّفْعِ عَلى الأفْرادِ وَ المُجْتَمَعِ بِمُخْتَلَف قِطاعاتِهِ.

# گەنج و لاوەکان

لاوەکان خونچەی بەهاری درەختی کۆمەڵگان، ئەوان وەک تۆو و ناوکی بەروبومەکان وان، بە دڵنیاییەوە ژیانی پرشنگدار و گەشەدار لەو تۆو و ناوکانەوە لە دایک دەبن.

لاوەکان ڕاگر و بنچینەی هەموو گەلێکن ئەوان پێشەوای گەشتی کۆمەڵگان بەرەو پێشکەوتن و گەشەکردن، جوڵەی لێدانی ژیانن لە دەماری خوێنبەری نیشتماندا، هیوایەکی ڕووناکی ڕۆشنن، زەردەخەنەی دواڕۆژی ڕوناکن و ئامرازێکی کاریگەرن بۆ دروستکردن و گەشەکردن.

هەر گەلێک خاوەنداریتی ئەم چینە بە نرخە بێت خاوەنی هێز و زیندوویەتیە، پێشکەوتن بەسەر هەموو گەلانی تر، ئەمانە هۆکاری بەرەو پێشچوونی گەلانن، نهێنی بەهێزی توانایین، ڕاگرن، قەڵای پارێزەرن، شمشێری پاراستنن، قەڵغانی پارێزگارین، گەنجیەیەکی لە بن نەهاتوون، سەرکەوتن بە گەنج و لاوانەوەیە. لە کاتێکدا ڕۆڵی گەنجان ون ئەبێت یان خراپ بەکاردەهێنرێت، بە خێرایی ڕوو لە گەل دەکات، سەرەتاکانی وەستان و تێکشکاندنی چالاکیەکان و وەستانی ڕەورەوەی پێشکەوتن.

لەسەر گەنج و لاوانە بە گەڕخستنی گوروتینیان و تێکۆشانیان بۆ خزمەت کردنی کۆمەڵگا، وە ڕاپەڕاندنی بۆ بەدەست هێنانی پێشکەوتن و بەرەو پێشچوون لە هەموو کایەکانی ژیاندا.

پێویستە دەستەبەری پێویستیە گرنگەکانیان بۆ بکرێ بۆ ئەوەی بتوانن تواناکانیان بحەنەگەڕ بە شێوەیەکی دروست بۆ ئەوەی بتوانن گۆڕانکاری گرنگ بکەن، وە سودەکەی بگەڕێتەوە بۆ تاکەکان و هەموو گەل بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە.

# العلْم

العلْمْ بحْرٌ واسعْ كُلّما شَربْتَ منْهُ شَعرْتَ بالظمأ هُو أساسُ تقدّم المُجتمعات، وَ سِرٌّ التطور في الحياة، و هُو المقياس الذي به تتطور الشعُوبُ و تقدّم الأمَمُ.

وَ قد سَهّلَ العلْم حَياة النّاس وَ جَعلَها أكْثر رَفاهيَة و قد تمّ اخْتراع المُواصَلات، وَ شَبَكات الإتْصال بفضْل العلْم، و إخْتراع الآلاتِ وَ المَصانع. وَ لَمْ يَكُنْ كُلُّ هذا لَولا فضْلُ العِلْمِ و العُلماء.

وَ لِلْعِلْمِ فَضْلٌ كَثير، لا تعُدّ وَ لا تحْصى، فَهُوَ أساسُ القضاء على الأمْراضِ وَ إيجاد العِلاجِ المُناسِب، وَ هُوَ الّذي خَفّف منْ آلامِ مَلايين البَشَر، بإخْتِراع الأدوِيَة المُناسِبَة لَهُمْ وَ مَنعَ مَوْتِهم الجماعي، وَ الكارِثة الإنسانيَة.

وَ قال الشّاعِر:

**بِالْعِلْمِ سادَ النّاسُ في عَصْرِهِمْ**

**وآخْتَرقُوا سَبْعَ الطّباق الشّداد**

وَ نحْتاجُ إلى خُطُواتِ الطّويلَة لِكَسْبِ العِلْم بِصُورَة صَحيحَة وَ نشْر الثّقافَة المُتَقدِمة.

وَ مِنْ هُنا نَفْهَمُ بِأنَّ العِلْم البابُ الرّئيسي لِدخُول إلى ما نحتاجُهُ مِنْ حَياتِنا اليَوْمِيَة وَ إذا دَخَلْنا مِنْ هذا الباب كُنّا فائزينَ في جَميع أمُورِنا بِصُورَة صَحيحَة وَ مُسْتَمِرَة.

# راس

راس دەریایەکی فراوانە هەتا ئێستا بخوێنەوە هەست بە بوونی ئەکەین، راستی سەمای بزنسکەوتی گەلانە. و بونی بزنسکەوتنی زیانە، ئەوە ئەو بنوەرەیە کە بە هۆیەوە گەلان گەشە دەکەن.

راستی ئاسانکاری لە ریانی حەڵکدا کردوە وای لێ کردوە ریانی خۆشی بە ریان بەخشێ، هۆکارەکانی گواستنەوە داهێنراوە، وە هێڵەکانی گواستنەوە بە گەورەیی راستەوەیە، و داهێنانی ئامێرەکان و کارگەکان، ئەمانە هیچیان بە ئەنجام دێ ئەگەر راست و راناکان نەبووایە.

راستی گەورەیی زۆرە لە ژمارە نایەت، سەمای دەست بەسەراگرتنی بەخۆشیەکانە وە بەدەستهێنانی چارەسەری گونجاو، ئەو دەتوانێت ئازاری ملیۆنەها سووک بکات، بە بەدی هێنانی دەرمانی گونجاو و رێگری لە مردنی بە کۆمەڵ، وە کارەساتی مرۆیی. شاعیر دەڵێ:

بە راستی گەورەبووین حەڵکی لەسەردەمی خۆیانا

بناسەران حەوت چینی ئاسمانی بە هێز

بنووسیمان بە هەنگاوی درێژ هەیە بۆ بەدەستهێنانی راستی بە شێوەیەکی راست و دروست وە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری بزنسکەوتووخوازی.

لێرەدا بۆ دەگەین کە راستی دەرگای سەرەکییە بۆ خوێندنەوەی بنووسینەکانی ژیانی رۆژانەمان ئەگەر لەم دەرگایەوە خۆی رووەوە ئێمە سەرکەوتووین لە هەموو کارەکانماندا بە شێوەیەکی راست و بەردەوام.

# مكانةُ الوالِدَيْن

إذا كانَ مِنَ الطّبيعي أنْ يَشْكُرَ الإنسانُ مَنْ يُساعِدُهُ و يُقدمُ لَهُ يَدُ المُساعِدَة، فإنّ الوالِدَيْن هُما أحَقُّ الناس بالشُكرِ وَ التقديرُ لِكَثْرَةِ ما قَدّما مِنْ عَطاء و حُب لأولادهما دونَ إنْتِظار مُقابِل، وَ أعْظَمُ سَعادَتِهِما أنْ يُشاهِدا أبنائِهِما في أحْسَنِ حالٍ وَ أعْظَم مَكانة.

وَ يَجِبُ الأنْفاق عَلَيهِما مالياً وَ تَلْبيَة إحْتياجاتِهِما وَ سَدّ نَقصهما حَتى إذا لَمْ يَكونا فَقيرَيْن، فَالوالِدانِ يَفرَحانِ بإنفاق أبنائِهِما عَلَيْهِما، إذْ يَشْعُرانِ بِأنّ جُهْدَهُما لَمْ يَضِعْ سُدى، و إسْتِعْمالُ الأدَبِ في الحَديثِ مَعَهُما وَ مُخاطَبَتِهِما بِأحَب الأسْماء إلَيْهِما.

وَ حَرَصَ الإسْلام عَلى إكرامِ الوالِدَيْنِ وَ رِعايَتِهِما وَ جَعَل ذلِكَ في مَرْتَبَة الجِهادِ في سَبيلِ الله عِنْدَما قَرّرَ الرَّسُول {صلى الله عَلَيْهِ وَ سَلّم} إبْقاء أحَد الصَّحابَة في خِدْمَة وَالِدَيْهِ بَدَلاً مِنْ خُروجِهِ إلى الجِهاد.

وَ الحَقّ العَظيم عَلَيْنا رِعايَتِهِما، وَ طاعَة أوامِرِهِما وَ التَلَطُف عِنْدَ مُخاطَبَتِهِما، وَ إسْتِعْمال أعْذَبُ الكَلِمات وَ أجْمَلُها عِنْدَ الحَديثِ مَعَهُما.

وَ مُقابَلَتِهِما بِالوَجْه البَشوش، وَ التَرْحابِ بِهِما، وَ الإكْثار مِنَ الدُعاءِ وَ الإسْتِغْفار لَهُما في حَياتِهِما وَ بَعْدَ مَماتِهِما وَفاءً لَهُما.

# پلەوپایەی دایک و باوک

ئەگەر شتێکی سروشتی هەبێت کە مرۆڤ سوپاسی ئەو کەسە بکات کە یارمەتی داوە، وە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات، بە دڵنیاییەوە دایک و باوک شایانترین کەسن کە سوپاس بکرێن وە ڕێزگرتن لەو زۆرەی کە پێشکەشیان کردوە لە بەخشین و خۆشەویستی بۆ منداڵەکانیان، بێ ئەوەی چاوەڕێی دەست خۆشیان لێ بکەن، باشترین پارەتیان ئەوەیە کە نەوەکانیان ببینن لە باشترین ژیان و بەرزترین پلەدا بن.

پێویستە دەستەبەری بەخێوکردنیان بکرێت بە ماڵ وسامان پێویستیەکانیان جێبەجێ بکرێت، ناتەواویەکانیان پڕ بکرێتەوە هەتا ئەگەر هەژاریش نەبن، باوک و دایک پێخۆشحاڵ دەبن بە سەرف کردنی ماڵ بۆیان لە لایەن منداڵەکانیانەوە، لێرەوە هەست ئەکەن ڕەنجیان بە فیڕۆ نەچووە.

ئیسلام خەڵکی هەڵناوە لەسەر ڕێزگرتنی دایک و باوک وە چاودێری کردنیان، ئەمەی لە پلەی خەباتکردن لە ڕێگای خوادا داناوە لە کاتێکدا پێغەمبەر درودی خوای لێبێت بریاریدا بۆ یەکێ لە هاوەڵەکانی کە بمێنێتەوە و خزمەتی دایک و باوکی بکات لە باتی چوون بۆ جیهادکردن لە ڕێگای خوادا.

پێویستی گەورە لەسەر شانمان چاودێریان بکەین فەرمانەکانیان پەیڕەوی بکەین، بە نەرمی لەگەڵیاندا بدوێن نەرم و نیانترین و جوانترین وشە بەکاربهێنین لە کاتی گفتوگۆ کردن لە گەڵیاندا.

لە بەرامبەریاندا دەم و چاومان گەش بێت، بە خۆشحاڵیەوە، و خۆشەویستی بەرەوڕوویان ببینەوە، وە زۆر بۆیان بپارێینەوە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەین، لە ژیانیاندا وە لە دوای مردنیان بە ئەمەک بین بۆیان.

# الأَمَل

الأمَل تِلْكَ النّافِذَةُ الصّغيرَةِ الّتي مَهْما صِغَرُ حَجْمِها، إلا إنّها تَفْتَحُ آفاقاً واسِعَة في حَياة الإنسان بِصُورَة عامَة.
فَهُوَ يَبْعَثُ الفَرَحِ وَ الطّمأْنينَة، يَشْجَعُنا عَلى الصّمُود وَ المُثابَرة وَ عَدَم الإسْتِسْلام، يَبْعَدُنا عَنِ الكَسَلِ وَ الكآبَة وَ الإحْباط، وَ مادامَ في قلُوبِنا الأمَل سَنُحَقِق الحِلْم، وَ سَنَمْضي إلي الأمام.
لا مَعنى لِلْحَياة مِنْ دونِ الأمَل، فَالْحَياة مَليئَةٌ بالعَقَباتِ وَ المَشاكِلِ وَ الصّعوبات، فَإذا فَقَدَ الأمَلُ فَلا نَسْتَطيعُ أنْ نَكْمُلَ طَريقِنا بِسَلام نَحْوَ حَياة طَيّبَة. وَاليَأسْ بَحْرٌ بِلا نِهايَة، أبْحَرُ فيهِ الكَثيرون لِيَرسُوا بِهِمْ عَلى شَواطىء مُظْلِمَة وَ مَعْتَمة.
وَكَيْفَ يَسْتَسْلِمُ المَرْءُ لِلْيأس، وَ هُوَ يَعْلَمُ أنَ الحَياة لا تَدُومُ عَلى حال، وَ أنَ بَعْدَ كُلّ المَشَقّات يَأتي التَيْسير وَ السهُولة. قالَ الشّاعِر:

**إذا الأمْر أعْيا اليَوم فَانْظُرْ غَدًا**
**لَعَلّ عَسراً في غّد يَتَيَسّرْ**

وَ الأمَل الشَيء الوَحيد أمامَنا لِيَجْعَلَ الحَياة كُلّها بَهْجَة وَ سروراً، و يُؤتي ثَمَراتُهُ اليانِعَة، وَ تَعُمّ خَبْراتُهُ المُبارَكة.
وَ إذا نَظَرْنا إلى حَياتِنا بِالأمَل، فَالطّريق سَهْلَة المَنالِ لِكُلّ ما نُريدُهُ وَ في النّهايَة الهدُوء وَ الإطْمِئْنان.

# هیوا

هیوا ئەو دەرچە بچووکەیە هەرچەندە قەبارەی بچوک بێت، بەڵام ئاسۆیەکی فراوان دەدات بە ژیان بە شێوەیەکی گشتی.
هیوا خۆشی و دڵنیایی زیندوو دەکاتەوە، هەڵمان ئەنێت لەسەر خۆراگری و بەردەوامی بە چۆکدا نەهاتن، دورمان دەخاتەوە لە تەمبەڵی و خەمۆکی و تێکشان، لەبەر ئەوەی لە دڵماندا هیوا هەیە حەوبەکانمان بەدی دەهێنین، بەرەو پێش دەچین.
ژیان هیچ مانایەکی نیە بەبێ هیوا، ژیان پڕ لە کۆسپ و کێشە و ناڕەحەتییەکانە، ئەگەر هیوا ون بکەین ناتوانین درێژە بە ڕێگا بدەین بەرەو ژیانێکی باش.
بێهیوایی دەریایەکە بێ کۆتاییە زۆر خەڵک مەلەیان تیا کردوە لەنگەریان گرتووە لە لێوارە لێڵ و زۆر تاریکەکاندا.
چۆن دەبێت مرۆڤ خۆی بدات بە دەست بێهیواییەوە لەگەڵ ئەوەی دەزانێت ژیان لەسەر یەک ئاست بەردەوام نابێت، لە دوای هەموو ناڕەحەتییەکان ئاسانی بەتە کابەوە. شاعیر دەڵێت:

ئەگەر ئەمڕۆ کارەکە گران بوو چاوەڕێی بەیانیبە
نزیکە ناڕەحەتیەکان لە بەیانیدا ئاسان بێت

هیوا تاکە ڕێگایە لە بەردەمماندا بۆ ئەوەی ژیانمان بۆ بگۆڕێ بە خۆشبەختی و خۆشی، بەرهەمە تازەکانی بە دی بهێنێت، خێر و خۆشی بڵاو بکاتەوە.
ئەگەر لە ڕێگای هیواوە سەیری ژیانمان کرد ڕێگا ئاسانە بۆ گەیشتن بە مەبەست بۆ هەموو ئەو شتانەی خوازیارین، لە کۆتاییدا بێدەنگی و دڵنیابوونە.

# السّلام

يُعْتَبرُ السّلامُ وَسيلَة لِتَحْقيق الوِئامِ بَيْنَ الشعُوب، فَعِنْدَما يَسُودُ بَيْن الشعُوب مَهْما اخْتَلَفَ جِنْسُها وَ أُصُولِها، فَتَبْعُدُ عَنْهُم التَصَادُ وَ الإنْتِقامُ وَ الشَرّ، وَ تَسُودُ بَدَلاً عَن ذلِكَ المَحَبّةِ وَ التّعاون.

الأنْسان الشّهمُ الكَريم الذي يَفْعَلُ الجَميل، وَ يَصْنَعُ الخَيْر، وَ يَشيعُ الأمان، وَ يَطوي بَيْنَ يَدَيْهِ السّلام وَ الوِئام، يَتَمَتَّعُ بِقَدَر وافِ مِنَ المُروَءَة والشّهامَة، وَ لا يُمْكِن إهْمالُهُ أبداً في الحَياة.

وَ السّلام كَلِمَةٌ طَيّبَةٌ أصْلُها ثابِتٌ وَ فَرْعُها في السّماء،مُفيدَةٌ لِلْجَميع وَ تَنْبَعُ مِنْها الحُرّيَة، التي يَطْمَعُ لَها الجَميع.

وَ حينَما تَجْتَمِعُ كَلِمَةُ الأمّة بِأَنْ يَسْمَعُ كُلّ واحِد رأي الآخَر، وَ يُناقِشُهُ فَيَكونُ الوصُولِ إلى النَتيجَة بِأقْصى السُرعَة، وَ لا يَكونُ ذلِكَ إلا في ظِلّ السّلام، وَ الإسْتِقْرار.

وَ ان الحَرْب وَ العَدوَاة سَبَبانِ لِكُلّ فَساد وَ عبودِيَة، وَ لَعْنَةٌ لِلْبَشَريِة.

وَ ان الأمَمُ التي سَبَقَتْنا في مِضْمارِ الحَضارَة وَ التّقَدُم ما سَبَقَتْنا إلّا لأنها شَعِرَتْ بِوَحْدة المُجْتَمَع حَياةً وَ مَصيراً، وَعُدّتُها السّلامُ وَ التّضامُن، وَ سِلاحُها التّوادُ وَ التّراحُم.

فَلا غَرابَة إذا قُلْنا انّ السّلام الطّريق الوَحيد لِلأمان، وَ أقْوى ضَمان لِلْعَيْش بِالْهُدوء وَ الحُريَة وَ الإطْمِئْنانِ وَ الصّعُود نَحْوَ القِمّةِ وَ إسْتِقْلالِ البِلاد.

# ئاشتی

ئاشــتی دادەنرێــت بــە هۆکارێــک بــۆ چەســپاندنی خۆشەویستی لە نێوان گەلاندا، لە هەرکاتێکدا هەرگەلێک لەگەڵ جیاوازی ڕەگەز وبنچینەیان لێی سوودمەندبن، دژایەتی و تۆڵەکردنەوە و خراپەیان لێ دوور دەکەونەوە لە جیاتی ئەوە بەهرەمەند دەبن بە خۆشەویستی و یارمەتی یەکتر دان.

مرۆڤی بەرز و بەخشندە کە کاری جوان دەکات، خێر دروست دەکات، ئارامی بڵاودەکاتەوە، لە نێوان هەردوو دەستیدا ئاشتی و خۆشەویستی ڕێیە بە ئەندازەیەکی پێویست خاوەنی کەسایەتی و پیاوەتیە، وە ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت لە ژیاندا.

ئاشتی وشەیەکی پیرۆزە بناغەیەکی پتەوی هەیە کە لقەکانی لە ئاسماندایە، بەسوودە بۆ هەموان و ئازادی لێ هەڵدەقوڵێ، کە هەمووان زۆر هەوڵی بۆ دەدەن.

لە کاتێکدا وتەی گەل یەک دەبێت بەوەی هەر کەس گوێ بۆ بۆچوونی بەرامبەر دەگرێت، لەگەڵیدا وتوێژ دەکات بە ئاسانترین و خێراترین کات دەگەنە ئامانج ئەمەیش نایەتەدی جگە لە ڕێگای ئاشتی و سەفامگیری نەبێت.

بێگومان شەر و دوژمنایەتی دوو هۆکاری بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و بە کۆیلە کردنن و نەفرەت لە مرۆڤایەتی.

ئەو گەلانەی لە ڕێڕەوی شارستانی پێشکەوتن لە پێشمانەوەن تەنها بە هۆی هەستکردنیان بە یەکریزی گەلان لە ژیان و داهاتوودا وە توێشوویان ئاشتی بوە، وە حەکەکانیان خۆشەویستی، وە بەبەزەیی بوون لەگەڵ یەکدا. شتێکی نامۆ نیە ئەگەر بڵێین ئاشتی تاکە ڕێگایە بۆ سەرفراری، وە باشترین گریمانەیە بۆ ژیان بە هێمنی و ئازادی و دڵنیایی و سەرکەوتن بەرەو لوتکە و سەربەخۆیی وڵات.

# الكِتاب

الكِتابُ وَ ما تَحْمِلُ صَفَحاتُهُ مَعانٍ كَثيرَة وَ قيمَة، لا يُمكنُنا الحصُول عَلَيْها وَ الإسْتِمْتاعِ بِها إلّا عَنْ طَريقْ قِراءَة الكُتُب.

فَالكِتاب هُوَ خَيْرُ جَليسٍ لِلْأنْسان في حَياتِه، فَكُلُّ كِتاب نَقْرَأهُ يَأخُذُنا مَعَهُ إلى عالَم آخَرْ لِنَشْعُر بِأنّنا جُزءٌ مِنْ ذلك العالَم.

وإنَ الكتابْ هُوَ زادٌ فكري وَ مَعرفي يَحْتاجُهُ كُلّ انسان مَهْما كانَ تَخَصُصُهُ في الحَياة.

وَ قيلَ: (وَراءَ كُلُّ كِتاب فِكْرَة وَ وراءْ كُلُّ فِكْرَة خُطْوَة الى الأمام).

وَ عَلى الرّغْمِ مِنْ إنْشِغال النّاس في الآوِنَة الأخيرَة بِالتَطَورات التَكنولوجيَة، وَ كانَ لِكِتاب ما زالَ أهْمِيَةٌ كَبيرَة وَ هُوَ تَنْمي شَخْصِيَةُ الفَرْد عَلى الثّقافَة المُتطَورة، وَ الحَياة الأفضَل.

وَ قِراءة الكُتُب تَكْسِبُ الفَرْدِ العَديد مِنَ الخِبْرات وَ المَهارات المُتَنَوّعة، كَما تَثْرى لُغَتُهُ بِالكَثير مِنَ المُفْرداتِ وَ العِبارات.

وَ أخيراً يَكونُ تَبادُلُ الكُتُبِ وَ إهْداؤُها بَيْنَ الدُوَل، وَسيلَةٌ لِتَحقيق التَّبادُل الثَقافي وَ المَعرفي بَيْنَهُما، فَيَتَعَرّف كُلّ شَعْب مِنَ الشُعوبِ عَلى ثَقافَة الآخَر، وَ وَسيلةٌ سَهْلَة تَقْرُبُ المَسافات مَهْما بَعُدَتْ.

# پەرتووک

پەرتووک ئەوەی لە لاپەڕەکانیدایە چەندین مانای زۆر و بە نرخە، ناتوانرێت بەدەست بهێنرێت و خۆشی لێ وەربگیرێت جگە لە ڕێگای خوێندنەوەی پەرتووک.

پەرتووک باشترین هاوڕێیە لە ژیاندا، هەموو پەرتووکێک کە دەیخوێنینەوە هەڵمان دەگرێت بۆ ژیانێکی تر ئەو هەستەمان تیا دروست دەکات بەشێکین لەو جیهانە.

ڕێگومان پەرتوک توێشووی ڕواو و زانستە ، هەموو مرۆڤێک پێویستی پێی دەبێت خاوەنی هەر پسپۆرییەک بێت.

وتراوە " لە دوای هەموو پەرتووکێ بیروڕایەک هەیە ، لە دوای هەموو بیروڕابەکەوە هەنگاوێ هەیە بەرەو پێشەوە"

لەگەڵ ئەوەی لەم ڕۆژانەی دوایدا خەڵکی سەرقاڵی بە پێشکەوتنە تەکنەلۆجیەکانەوە، بەڵام پەرتووک گرنگیبەکی گەورەی هەر ماوە، گەشە پێدەرێکی کەسێتی تاکە لە لایەنی ڕۆشنبیری پێشکەوتوو، ژیانێکی باشتر.

خوێندنەوەی پەرتووک جۆرەها لێزانی و زیرەکی جۆراوجۆر دەبەخشێ بە مرۆڤ، هەروەکو دەوڵەمەندی دەکات بە زۆر لە وشەکان و دەستەواژەکان.

لە کۆتایدا دەستاودەستکردنی پەرتووک و بەخشینی لە نێوان وڵاتاندا،هۆکارێکە بۆ گۆڕینەوەی ڕۆشنبیری و زانست لە نێوانیاندا، هەموو گەلێک ئاشنا دەبێت بە ڕۆشنبیری گەلەکەی تر، هۆکارێکی ئاسانە دووری نێوانیان نزیک دەکانەوە هەر چەندە دوربێت.

# المُطالَعة

المُطالَعَـة ثَقافَـة ذاتِيَـة وَسـيلَةٌ مِـنْ وَسـائِل اكْتِسـاب المَعْرِفَه، وَ ذلِكَ مِنْ خِلال قِراءَة الكُتُبِ وَ الصُّحُفِ وَ المَجَلات، وَ جَرْيِ وَراءَ المَعْلومَة أنى وجِدَتْ.

وَ تَعُدّ المُطالَعـة أحَـدْ أهَـمّ أدَوات الحصُول عَلـى المَعْرِفَـة، فَهِـي تُتـيحُ لِلأنْسـان اِتِصـالاً مُباشِـراً بِالمَعـارِف وَ العلـوم الأنْسـانِية حاضِراً وَ ماضِياً وَ هِـي مِـنْ أهَـمّ وَسـائِل تَواصُل الأنْسانِية مَعَ أفْكار وَ آراء الآخَرين.

الشَـخْصُ الّذي يَقْضي وَقْتاً خاصاً بِـهِ في المُطالَعة، هُوَ إنْسـان أخْـرَجَ نَفْسَـهُ مِـنْ دائِـرة القَيْـد الفِكـري الـى البِنـاء لِمهارِاتِـهِ الفِكْرِيَـة وَ العَقْلِيَـة، وَ يَسْـتَفيدُ مِـنَ الثَقافَـة، وَ المَعْلومات المُفيدَة الّتي يَحْصُلْ عَلَيْها في حَياتِهِ الخاصّة وَ العامّة.

و الشَخصِيَةُ السّامِيَة تَرْتقـى بِـالعِلْمِ وَ الثَقافَـة، وَ تَتـدنى بِالجَهْلِ وَ التَخَلّف، فَالشَـخْصُ المُطَلِع وَ المُثَقَف، هُوَ صاحِب قُوَة وَ حُجّـة وَ بَيـان، وَ فـي يَديـهِ سُـلْطانُ العِلْـمِ وَ المَعْرِفَـة، الّذي هُوَ بِلا شَكّ سِلاحٌ يَتَسَلّح بِهِ المَرْء لِيَنْجُو مِنَ الجَهْلِ وَ الحَماقَـة، وَ لا شَـكّ أنَ إنْشِـغالْ بِالمُطالَعَـة بـابٌ مِـنْ أبْـوابِ الخَيْرِ وَ الرَّحْمَة.

# خوێندنەوە

خوێندنەوە ڕۆشنبیرییەکی خودییە ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی بەدەستهێنانی زانست، ئەمە لە ڕێگای خوێندنەوەی پەرتووک و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە، وە ڕۆیشتن بە دوای زانیدا لە هەر کوێ دەست بکەوێ.

خوێندنەوە بە یەکێک لە گرنگترین هۆکارەکانی بەدەست هێنانی زانست، خوێندنەوە دەستەبەری ڕاستەوخۆی مرۆڤە بۆ گەیاندنێکی بە زانست و زانیاری مرۆڤایەتی لە ئێستا و کۆندا، ئەمە بە گرنگترین هۆکاری گەیاندنی مرۆڤ بە بیر و بۆچوونەکانی کەسانی تر دادەنرێت.

ئەو کەسەی کاتێکی تایبەت بەسەر دەبات لە خوێندنەوەدا ئەو مرۆڤەیە خۆی ڕزگارکردوە لە بازنەیەکی داخراوی بیرکردنەوە بۆ دروستکردنی زیرەکی و بیرکردنەوە و ژیرییەکان، سوود وەردەگرێت لەو ڕۆشنبیریانە و زانیاریە بەسودەکان کە بە دەستی دەهێنێ لە ژیانی تایبەت و گشتیدا.

کەسایەتی بەرز گەشە دەکات بە زانین و ڕۆشنبیری، وە دادەبەزێ بە نەزانین و دواکەوتن، ئەو کەسانەی دەخوێننەوە و ڕۆشنبیرن خاوەنی هێز و پێگە و ڕۆشنگەرین، لە دەستیاندا خاوەنداریتی و دەسەڵاتی زانین و زانست هەیە کە ئەمە بێ گومان چەکێکە هەڵگری دەبێت کەسێک بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت لە نەزانین و بێ ئەقڵی، وە بێگومان خۆ سەرقاڵکردن بە خوێندنەوەوە دەرگایەکە لە دەرگاکانی خێر و خۆشی.

# كِتابَة الرّسالة

لا أَعْرِفُ مِنْ أيْنَ أبْدأ وَ إلى أيْنَ سَأنْتَهي وَ عَجز اللّسان عَنِ التَعبير كَلِمات مِن ثَناياها حَساسِية قلبي و شَفاي. ما أعْذَبَ الكَلِمَة عِنْدَما تَخْرُجُ مِنَ القَلْبِ وَ ما أحْلاها عِنْدما تَكونُ صادِقة مُعَبّرَة عَمّا يَحْمِلُ فيها مِنْ حُبّ وَ تَفاؤل و أمل، تَتَرجَمُ عَنِ الحَياة الحُرّة الّتي تُداعِب جَدائِل الشّمْس، و تَحْتَضِنُ نَسيمُ الصّباحات النَدِيّة.

بِهذِهِ الإنْطلاقَة فَأنّي أكْتُبُ هذِهِ الرّسالَة مِنْ ثَنايا احَساسِ قَلْبي، وَ دِفْء مَشاعِري، فَأصُبُها إلى قلبك. كَلِماتٌ تُصافِحَ مُقْلتيك، لِتَورَق بَسْمُهما إلى شَذى وَ عِطراً نَديا، وَ ثَمَراً طَيّبَ المَذاق فَلَكَ أكْتُبُ لأنَكَ تَسْتَحِقُ أنْ تَقرأ كَلِماتي.

قلُوبِنا مَدينَة نَلْقى فِيها أناساً سَنَحْتَفِظُ بِهِم في أعْماقِنا، وَلَنْ يَتَمَكّنَ غُبارُ الوَقْتِ مِنْ إخْفاء مَلامِحِهِمْ، وَ سَنَظلُ نُصافِحُهُم بِشَوْق وَ نَحْتَويهِمْ بِحَنين.

وَ لا أقدِرُ أنْ أجْمَعَ أمْنياتي لَكَ في عَدّة أسْطُر عَلى وَرَقه بَيْضاء وَ لكِنْ يَحْتَوي عَلى بَعْض إحْساسي، وَ أتمَنّى لَكَ في النّهايَة التَوْفيق وَ السَّلام.

# نامە نووسین

نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم لە کوێدا کۆتایی پێ بهێنم، زمان بێ توانایە لە دەربڕینی وشە لە پیاهەڵدانی هەستەکانی دڵ و لێوانم.

چەند شیرینە کاتێ وشە ڕاستگۆیانە دەربڕێت ئەوەی تیایەتی لە خۆشەویستی و گەشبینی و هیوا، وەرگیرا بێت لە ژیانێکی ئازاد کە لە هێلەکانی جۆردا یاری بکات، وە شنەبای بەیانیان و شەونمی گرتبێتە ئاوەش.

لەم دەرچەیەوە من دەست دەکەم بە نووسینی ئەم نامەیە لە پیاهەڵدانی هەستی دڵمەوە، وە گەرمی سۆزمەوە، خۆشەویستی دەڕژێنمە دڵتەوە چەند وشەیەک بگاتە ئاست پێڵووی چاوەکانت، گەڵایەک دەربکات بۆندارێت بۆنی خۆشی و شەونمی، بەرهەمی تام خۆشی لە خۆ بگرێ، بۆ تۆی ئەنووسم لەبەر ئەوەی تۆ شایانی ئەوەی ئەم وشانە بخوێنیتەوە.

دڵی ئێمە شارێکە تێیدا بە یەک دەگەین لەگەڵ کەسانێک هەڵیان دەگرین لای خۆمان دەیانپارێزین لە ناخی دڵماندا، وە ناتوانێت تۆزی ڕۆژگار ڕواڵەتیان لێمان ون بکات، بەردەوامی بە توندوتۆڵی بە خۆشەویستییەکی زۆر بە سۆزەوە لە ئامێزیان دەگرین.

ناتوانم ئاواتەکانم کۆبکەمەوە لە چەند دێڕێکدا لەسەر پەڕەیەکی سپی بەڵام هەندێ لە هەستەکانم لە خۆ دەگرێت.

لە کۆتاییدا ئومێدی سەرکەوتن و بە ئاشتی ژیانت بۆ دەخوازم.

# الوَطَنْ

الـوَطَنْ كَلِمَـةٌ صَـغيرَة، تَحْمِـلُ مِـنَ المَعـاني الكَثيـرَة وَ العَظيمَـه، وَ هـي فَخْـرٌ وَ إعْتِـزازٌ وَ شَـهامَة يَحْمِلُهـا الـوَطَن لِأبْنائِهِ، وَ تُحافِظ عَلَيْها.
فَإنَّ الوَطَن يَشِبُّ وَ يَكْبُرُ وَ يَنْمُو في عيُون مُحِبِـه، فَالّذينَ لا أوْطانَ لَهُمْ، فَلا أَمْن لَهُمْ وَ لا عِزّ لَهُمْ.
وَ هُوَ المَكان الّذي نَتَرَعْرَعَ عَلى أرْضِهِ، وَ نَأْكُلُ مِنْ ثِمارِهِ وَ مِنْ خَيْراتِهِ، فَمَهْما أبْتَعَدْنا عَنْهُ يَبْقى في قلُوبِنا دائِما.
وَ يَعْتَبِرُ حُـبّ الـوَطَن رَمْـزاً، وَ فَخْـراً، وَ إعْتِـزازاً، لِـذلِكَ يَجِـبُ عَلَيْنـا أنْ نُـدافِعَ عَنْـهُ وَ نَحْميـهِ بِكُـلّ قُـوّة، وَ أنْ نَحْفَظَـهُ كَما يَحْفَظُنا، وَ المُحافَظَة عَلى نَظافَتِهِ وَ حِمايَة مُمْتَلكاتِهِ العامّة، وَ أنْ نَفْديـهِ بِأرْواحِنـا فـي حـال تَعَـرّض لِأي خَطَـر، كَمـا قـالَ الشّاعِر:

**أوْطانُنا أرْواحُنا بَلْ**

**إنّها بِالرُّوح تُفْدى**

وَ لَـوْ نَظَرْنـا إلـى تَأريخُنـا لَرَأيْنـا الكَثيـر مِـنَ الأبْطـال سَـقُوا الأرْض بِدِمائِهِم تَعْبيراً عَنْ حُبّهِمْ لِوَطَنِهِم.
فالوَطَن أغْلى مِنْ روحِنا يَجِبُ أنْ نُدافِعَ عَنْه في كُلّ أوْقات وَ الزّمان، في وَقْتِ السّـلْم نَعْمَـلُ مُخْلصينَ لِرَفْع عِلْم بِلادِنا عالِياً، وَ في الحَرْب نَحْضُرُ أنْفُسِنا لِلدّفاع وَ نَقْدِمُ أرْواحُنا فِداءً لَه.

# نیشتمان

نیشتمان وشەیەکی بچوک، هەڵگری مانایەکی زۆر و گەورەیە، ئەوە ڕێز و شانازییە کە نیشتمان هەڵی گرتووە بۆ ڕەوەکانی ، پارێزگاری لێدەکات. بێگومان نیشتمان لاو ئەبێت گەورە و گەشە دەکات لە چاوی خۆشەویستانی، ئەوانەی نیشتمانیان نیە، نە ئاسایشیان هەیە نە سەربەرزی.

نیشتمان ئەو شوێنەیە تێیدا پێ دەگەین لەسەر ڕەوبەکەی، لە بەروبوم و شتە باشەکانی دەخۆین، هەرچەندە لێی دوور بکەوینەوە بەردەوام لە دڵماندا دەمێنێتەوە.

خۆشەویستی نیشتمان دادەنرێ بە پێناسە و شانازی، و گە ورەیی، لەبەر ئەوە پێویستە لە سەرمان پارێزگاری لێ بکەین بە هەموو توانابەکەوە بیپارێزین چۆن دەمانپارێزێ، وە پارێزگاری لە پاک و خاوێنی و پاراستنی شتومەکە گشتییەکان، وە ژیانمانی پێ سەخشین ئەگەر تووشی هەر ترسناکییەک هات. هەر وەک شاعیر دەڵێت:

نیشتمان گیانمانە بەڵکو بەدڵنیاییەوە بەگیان دەپارێزرێ

ئەگەر تێڕوانینێ لە مێژووماندا بکرێت ئەبینی زۆر لە کەڵە پیاوان زەوییان بە خوێنیان ئاوداوە وەک دەربڕینێک بۆ خۆشەویستی نیشتمانەکەیان.

نیشتمان لە گیانمان شیرینترە پێویستە پارێزگاری لێبکەین لە هەموو ساتێکدا، لە کاتی ئاشتیدا کاردەکەین بە دڵسۆزییەوە بۆ بەرزڕاگرتنی ئاڵای نیشتمان، وە لە کاتی جەنگدا خۆمان ئامادە دەکەین بۆ پارێزگاری گیانمانی پێ سەخشین، گیانمان پێشکەش بەو دەکەین.

# الحُرّيَة

الحُرّيَة أعْذَبُ وَ أقْدَسُ قِيَمِ الأنْسان، وَ ضَوْءٌ يَحْتاجُ لِكُلِّ نَفْسٍ، وَ مِنْ أجْلِها قامَتِ الحُروبُ وَ الثَوْرات على مَرّ التاريخ و الزّمان.

مِنْ حَقّ الأنْسان الحَياة في ظِلّ نِظام سياسي و إجْتِماعي عادِل يَحْتَرِمُ إنْسانِية الأنْسان، وَ يَتعامَل مَعَهُ كَعَقل وَ فِكر وَ رُوح، فالخالِقُ العَظيم خَلَقَ الأنْسان، وَ كَرّمَهُ على باقي مَخْلُوقاتِهِ.

وَ الحُريَة لَيْسَتْ مُجَرّدْ كَلِمَة يَتناوَلُها الجَميع بِدون أن تَتَرجَّمَ إلى إحْساس إنْسان بِقيمَة هذِه الكَلِمَة العَظيمَة، لأنَّ تطبيق هذِهِ الكَلِمَة في مَجالاتِ الحَياة المُخْتَلِفَة بِمَثابَة الهَواء لِحَياة الأنْسان.

ما أعْذَبَ هَواءُ الحُريَة وَ نَسيمِها، عِنْدَما يَقولُ الأنْسان ما يَشاءُ وَ يَكْتُبُ ما يُريد، لِيَخْرُجَ كُلَّ ما في أعْماقِهِ وَ فِكْرِه، لكِن دونَ أنْ يَكونَ ذلِكَ عَلى حِساب الغَير وَ دونَ أنْ يَمُسّ كَرامَتِهِم وَ أوْ يَجْرَحَ مَشاعِرَهُمْ.

ما هُوَ أسْوَأ مِنَ العَيْشِ في أجْواء مُظْلِمَة يَسُودُ فيها الجَهْل وَ القَمْعِ وَ إرْهابِ الفِكْري وَ الإسْتِبْداد.

لا سَبيلَ إلى السَّعادَة في الحَياة إلّا إذا عاشَ الأنْسان فِيها حُرّاً طَليقاً فِكْرَهُ وَ رُوحَهُ وَ جَسَدَهُ.

# ئازادی

ئـازادی پـاکزترین و پیرۆزتـرین بـەها مرۆڤایەتییەکانـە، وە رۆشـنایـە کـە پێویسـتە بـۆ هـەموو دەروونێـک، لـە پێناویـدا چەندین شـەڕە کـان وشۆڕشـە کـان بەرپاکراوە بـە درێژایـی مێژوو و کاتەکان.

مـافی مرۆڤـە بژی لـە ژێـر سـێبەری ڕژێمێکـی ڕامیـاری و کۆمەڵایەتی دادپەروەر کە مرۆڤایەتی مرۆڤ ڕێز لێبگرێـت، لـە گەڵیدا هەڵسوکەوت بکات وەک ژیـری و بیرکردنـەوە و گیـان، پـەروەردگاری گـەورە مرۆڤـی دروسـتکردوە، ڕێـزی لێنـاوە لەسەر هەموو دروستکراوەکانی.

ئازادی تەنها وشـەیەک نییە کە هـەموو باسـی لێوە بکـەن بێ ئـەوەی وەربگێردرێتـە سـەر ئـەو هەسـتە مرۆڤیـەی بـە بەهای ئـەم وشـە گەورەیـە، چونکـە جێبـەجێ کردنـی ئـەم وشـەیە لە کایە جۆراوجۆرەکانی ژیان وەک هـەوا پێویسـتە بـۆ ژیانی مرۆڤ.

چەند گەورەیە بای ئازادی و شنەبای ڕێگەردی، لـە کارێکدا مـرۆڤ ئـەوەی دەیـەوێـت دەیڵێـت، وە ئـەوەی دەیـەوێت دەینووسـێت، بـۆ ئـەوەی جـێ لـە قـوڵایی مێشـک و بۆچونیایـەنی بخاتـە ڕوو، بـەڵام نابێـت کـار بکاتـە سـەر کەسـانی تـر، بێ ئـەوەی دەسـت بـدات لـە بـەها و ڕێـزی کەسانی تر یان هەستیان بریندار بکات.

لـەوە ناخۆشـتر چییـە ژیـان لـە کـەش و هەوایـەکی تاریـک باڵی بەسـەردا بکێشـێن نـەزانین و داپڵۆسـین و تۆقانـدنی بیروبۆچـوون و خۆسـەپاندن. هـیچ ڕێگایـەک نییـە بـۆ خۆشبەختی لە ژیاندا جگە لـەوەی بژی بـە ئازادییـەکی بێ مەرج لە بۆچوون وگیان و لاشە.

# الفدائي {پێشمەرگە}

پێشمەرگە لَفظٌ كُردي تُطلَقُ على الشخص الذي يقوم بالتحلي عن كُلّ شيء، و تقديم الرّوح من أجل الحفاظ على إستقرار البلد.

وَ ليسَتْ هذهِ كلمة فقط تُقالْ، بَلْ هي فِعْلُ الحقيقي يقوم بفعْلِهِ كُلُّ شخصٍ وطَني مُحِبٌّ لِوطَنه.

وَ أجْدادُنا قَدَمُوا أرْواحَهُمْ في سَبيل أنْ نَعيشَ نَحْنُ جيلُ المُسْتقْبَل في أمانٍ وَ إسْتِقرار.

فكُلّ مَنْ يَستَعِدّ نفْسَهُ لِلتضحِيَة، هوَ ذلِكَ الأنسان الّذي يَصِلُ لِمَرْحَلَة مِنَ الصَفاء الرُوح وَ مِنَ الإدْراكِ التّامِ وَ تنافس الجِبال في رَساختِها، وَ لَنْ يَخْلو هذا البَلَدُ العَظيم مِنْ أبْطالَ المُضحينَ بِأمْوالِهم وَ أنْفُسِهِم مِنْ أجْلِ الوَطَن، وَ حَتّى يَوْما هذا، هُناكَ كَثيرٌ وَ كَثيرُ الحامينَ لِلْوَطَن، وَ عُيونُهُم ساهِرةٌ في كُلّ لَحْظة دِفاعاً عَنْ الأسْتِقْلال وَ الحُرّيَة وَ الأمان.

وَ في السّنَواتِ الأخيرَة أثْبَتَتْ لِلْعالَم شُجاعَة أبْطال الكُرد، وَ اعْتَرفُوا بِذلِك، وَ حاوَلُوا إرْسال المَعُونات الماديَة وَ العَسْكَرية حَتّى يُشارِكوا هذا الفَضل، وَ المَجْد وَ الخلُود لِلّذينَ رَسَمُوا بِدِمائِهِم البطولات وَ الأمْجاد.

# پێشمەرگە

پێشمەرگە وشەیەکی کوردییە بەو کەسە دەوترێ کە واز لە هەموو شتێک دەهێنێت لە خۆشییەکانی ژیان، وە پێشکەشکردنی گیان لە پێناو پارێزگاری نیشتمان، وە بەرقەرار بوونی ئاسایش و بەترسان، وە پارێزگاری لە سەقامگیری وڵات.

ئەمە تەنها وشەیەک نییە بوترێ، بەڵکو کردارێکی ڕاستەقینەیە هەموو کەسێ پێهەڵدەستێ کە نیشتمان پەروەر و وڵاتەکەی خۆش بووێت.

باو و باپیرانمان گیانیان پێشکەش کردووە لە پێناوی ئەوە ئێمە نەوەی دواڕۆژ بە دڵنیایی و سەقامگیری بژین.

هەموو ئەو کەسانەی ئامادەن گیان ببەخشن، ئەوە ئەو مرۆڤانەن کە دەگەنە پلەی پاکی گیان و دەروون و هەستکردنی تەواو، پێشبڕکێ لەگەڵ شاخدا دەکەن لە دامەزراوەتیدا.

ئەم وڵاتە گەورەی لێ نابڕێت، ئەو قارەمانانەی گیان و ماڵ و دارایییان دەکەنە قوربانی نیشتمان، هەتا لەم ڕۆژگارە لێرەدا زۆرن و زۆرن پارێزکارانی وڵات، چاوەکانیان لێک نانێن هەمیشە کراوەیە لە هەموو ساتێکدا بۆ پارێزگاری لە سەربەخۆیی و ئازادی و دڵنیایی.

لەم ساڵانی دواییدا بۆ جیهان ڕوون بووەوە ئازایەتی قارەمانە کوردەکان، و دانیان پێدانا، وە هەوڵیاندا کۆمەکی دارایی و شێوەکی سەربازی بنێرن هەتا بەشداری بکەن لەو ساناریبەدا، مانەوە و سەربەرزی بۆ ئەوانەی بە خوێنیان وێنەی ئەو ئازادی سەرکەوتنیان تۆمارکرد.

# الصديق

تُعْتَبرُ الصَّداقة شَيءٌ جَميلٌ جِداً، وَ هو عُنْصُرٌ مُهِم في الحَياة وَ هو سِرٌّ مِنْ أسْرارِ السَّعادَة.

وَ صديقُك هو منْ يَعيشُ معك، وَ يُشابِهكَ في كُلِ الأمُور، سَواءٌ أكانَ ذلِكَ مِنَ الأذْواق أوِ الأفكار وَ غيرُها، و هو الّذي يَسُرّه أفْراحُكَ، وَ يَحْزُنُه آلامِك، وَ طَبْعُهُ يُوافِقُ طبْعُك.

فَالأنْسانُ لا يَقْدِرُ عَلى العَيْشِ بِلا أصْدِقاء مَهْما تَوفرَ لَهُ مِنْ نَعِمٍ وَ خَيْرات، وَتَيْسيرات الحَياة.

وَ تكونُ الصَّداقة في أكْمَلِ أوْجُهِها عِنْدَما تَتوافر لَها أسُس المَحَبَة وَ الفَضيلة.

وَنَحْتاجُ دائِماً في هذِهِ الحَياة إلى صَديق نَأْتَمِنْهُ عَلى أنْفُسِنا، وَ عَوْناً لَنا في وَقتِ الحاجَة. قالَ الشّاعر:

**سَلامٌ عَلى الدُّنْيا إذا لَمْ يَكُنْ بِها**

**صَديقٌ صَدوق صادِق الوَعْدِ مُنْصِفا**

وَ الصَّداقة تُحْفَة، تَزْدادُ قِيمَتها كُلّما مَضَى عَلَيْها الزَّمَن، وَ في كُلّ مَكان.

وَ مِنْ أعْظَم دَواعي بَقاء الصَداقة وَ الصُحْبة دَوام الإحْتِرام، وَ الإهْتِمام بِأمُوره، وَ عَوْناً وَ ساعِداً لِلْصَديق لأنَّ المَرْء قَليلٌ بِنَفْسِهِ، وَ كَثير بِإخْوانِه، وَ يَنْبَعُ ذلِك عَنْ سَماحَة نَفس، و خُلُق كَريم، و بَذْل لِلْمَعروف، وَ قَوْل طَيب.

# هاوڕێ

هاوڕێیەتی دادەنرێت بە کارێکی زۆر جوان، ترسە لە حاڵێکی گرنگ لە ژیاندا و پەیوەستەکە لە پەیوەستەکانی خۆشەویستی.

هاوڕێکەت ئەو کەسەیە لە گەڵت دەژی لە نێو دەچێ لە هەموو کاروبارەکانتدا، جا ئەوە لە ئارەزووەکانتدا بێت، یان لە بیرو بۆچوونەکانتدا یان لە شێوانی بیردا، ئەو کەسەیە کە خۆشییەکانت دڵخۆشی دەکەن، ئازارەکانت خەماری دەکەن، سروشتی هاوسروشتە.

مرۆڤ هەرچەند بار و گوزەرانی باش بێت هەموو خۆشی و خۆشگوزەرانی، ئاسانکاری ژیانی بۆ بەدی هاتبێ ناتوانێت بە بێ هاوڕێ بژی.

هاوڕێیەتی لە باشترین کاتەدا دەبێت ئەگەر بنەمای خۆشەویستی و گەورەیی بۆ دەستەبەر کرابێت.

هەموو کات لەم ژیانەدا پێویستمان بە هاوڕێیەک هەیە متمانەی پێ بکەین یارمەتیدەرمان بێت لە کاتی پێویستدا. شاعیر دەڵێت:

ماڵئاوا لە جیهان ئەگەر تیانەبێت
هاوڕێیەکی ڕاستگۆ بەیمان ڕاست بە ویژدان

هاوڕێیەتی گران بەهایە، نرخی زیاد دەکات هەتا زیاتر بجایەنێت و کاتی بەسەردا بڕوات، لە هەموو شوێنێکدا.

لە گەورەترین پاڵەرەکانی مانەوەی هاوڕێیەتی وبرادەری بەردەوامی و ڕێزگرتن، گرنگیدان بە کاروباری، و یارمەتیدەر دان و باڵپشتی کردن، چونکە مرۆڤ بە تەنیا کەمە، وە زۆرە لەگەڵ براکانی، ئەمە هەڵدەقوڵێ لە پاکێتی دەروون، ڕەوشتی بەرز، هەوڵدان بۆ چاکە و وتەی باش.

# الأَدَب وَ الثَقافَة

فَالأَدَب فَنٌّ مِنَ الفنُون الجَميلَة يَعْكِسُ مَظْهَراً مِنْ مظاهر الحَياة الإجْتِماعيَة وَ الثَقافية.
الكَلِمَة المُعَبِّرَة، تعبيرٌ فَني عَنْ مَوقِفٌ إنْساني يَنقُلُها الأديبُ وَ يَبْغى مِنْ وَرائِها المُتْعَةُ وَ الفائِدة.
فَلِلْكَلِمَة دَوْرٌ في بِناء المُجْتَمعات، وَ أكثَرُما يَظْهَرُ في المَواقِف الحَرِجَة وَ الأزمات وَ صانِع هذه الكَلِمات أديب مَلِك عَقْلاً واعياً مُتَسَلِحاً بِالوَعي وَ الإيمان بِالهَدَفِ وَ الثَقافَة المُتَطورة.
فَالأَديبُ يَمْلِكُ القُدْرَة عَلى رَبْطِ الماضي بِالحاضِر وَلَهُ عَيْنٌ تَكْشِفُ الغِطاء عَنْ روح الأُمَة وَ يَدٌ تَرْبُطُ بَيْنَ أجْزاء شَخْصِيَتِها وَ مَراحِل تَطَورِها.
وَ النَفسُ بِحاجَة إلى رُخاء في غِذائِها الفِكْري وَ العاطفي وَ الثَقافي، وَ الأدَباء يَجْلِبُونَ هذِهِ الحَقيقَة وَ يَقْدِمُون هذهِ الوَحية الفَنيَة لِلْمُجْتَمَع.
وَ يَجِبُ مُعامَلَة الأُدَباء على إخْتِلاف مَراتِبِهِمْ، وَ خاصَة الذينَ يَقومونَ بِخِدْمَة مَصالِح أُمَتِهِم بِالإخْلاص وَ الأمانَة، وَ جَلْبِ الأخْلاقِ الحَسَنة لَهُمْ بِكُلِّ الحُبِّ وَ التَقدير.

